


# ڕۆژان ڕۆژیان
# لە دوایە




حبيب محمد سعيد



تیشکێ لە قورئانەوە

# ڕۆژان ڕۆژیان لەدوایە

حبیب محمد سعید

---

چاپخانەی ( ارشاد ) ـ بغداد

١٤٠٥ك ـ ١٩٨٥ز

ﻃ - ق

# پێشکەش

پێشکەش بێت بە کۆمەڵی ئیماندار لە هەموو سەرزەوییدا .. ئەوانەی کە بەرامبەر هێزی خوانەناسیی ئەوەستن و بەو کەمژمارەیی و کەمتفاقییەی خۆیانەوە خەریکی بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی بێگەردی ئیسلامن ، بۆ ئەوەی ئادەمیزاد لە جەور و ستەمی نەفامان و ستەمکاران رزگار بکەن و سەرفرازی رۆژی قیامەت بن ..

# پێشەکی

**الحمد للـه رب العالمين والصـلاة والسلام على رسو**
**الأمـين وآلـه وصحبه أجمعين ..**

قوتـابیه ئازیزەکانی قورئـانی پیرۆز .. کۆمـەڵـی
ئیمانداری خواناس ، هەر کاتێ دەستیان دایـە قورئانی پیرۆ
و بـە نیازی لێکۆڵینەوە و بـە گوێکردنی لـە خزمەتیـ ک
بوونـەوە ، خێرا پێری دڵڕەش و ئارەزوو پەرست گڕیـا
تـێ بـەر ئـەبێ .. شـەیتان ئەچێتە بن کڵیشـیان و تێیـا
ئـەگەیەنێ کـەوا پـەرەسەندنی کۆمەڵـی خوانـاس بریتیە
لـە رمـانی قەڵای ستەمکاریی و خراپکاریان و تیـاچوونی
بـەرژەوەندیە نـاڕەواکانیان ..

کۆمـەڵـی بێویژدان کـە هەست بـە رۆشنایی رێبازی
قورئـانێ ئـەکـەن و بـەراوردی ئـەکـەن لـەگـەڵ
بەرژەوەندیەکانیانـا ، کـە تەنها لـە تاریکە شەودا پارێزرا

ئـەبن ، بیر ئەکەنەوە پێویستە بە هەموو شێوەیەك دژی هەڵگرانی قورئان بووەستن •• پێویستە بیانترسێنن •• ئازاری لاشەیی و دەروونییان بدەن •• گاڵتە و سزای سەخت بخەنە کار بۆ دڵ ساردکردنەوەیان •• یەك لە دوای یەك هەموو هەنگاوێك بگرنە بەر بۆ پەشیمان کردنەوەیان و تەفر و توونا کردنیان ••

کۆمەڵی موسڵمانی کەمهێز و کەمدەسەڵات ئەبێ لە بەر دەم ئەم هەموو ناپاکیی و بەدکارییەدا هەڵوێستی چۆن بێ ؟!

ئەبێ چۆن نەخشە بکێشێ تا رۆژانی رەش و پڕ ستەم و ناڕەوایی بە سەر بەرێ ؟! لە کاتێکا ئەوەندە ستەم و ئازاری خوانەناسە بێویژدانەکان بە تینە کە هیوای سەرفرازیی بە هیچ شێوەیەك تروسکەی دیار نییە ؟!

کۆمەڵی موسڵمان کاتێ لە دەوری قورئان کۆ ئەبێتەوە ، چاك لای روونە بە هیوای هیچ بەرژەوەندییەکی

جیهانی‌نییه • خۆوا ستەم و ئازاری بێ وچانی کافرانیش شەوە زەنگی هێناوە بە سەریا •• بە هەر بارێکا سەیر کا هەر ستەم و ناڕەوایی ، فیز و دەماری نەفامان ، ئازار و سزای بیر لێ نەکراوە دێتە بەرچاوی •• لە ترسی ئەم بەدکاریی و تاوانکارییانە ، ئادەمییەکان دەستە پاچە لە دوورەوە وەستاون •• ئەگەر نزیك ئەبنەوە ئەوانیش ئەسووتێن ، دووریش ئەکەونەوە ژیانی تاڵ و ئاڵۆزی چەندەها ساڵە گیری داون •• ناچارن چاوەڕێ بکەن ••

کۆمەڵی موسڵمان لە بەر دەم ستەمکارانا و لە بەر دەم ئادەمییەکانی ترا بەڵێنێکی داوە •• بڕیاری داوە هەڵگری چرای سەرفرازیی بێ •• چۆتە مەیدانەوە و بانگی ئادەمییەکان ئەکات بۆ شوێنکەوتنی ڕێگای سەرفرازیی •• وا خراپکارانیش بە هەموو توانایەکیانەوە هەوڵی تواندنەوەی ئەدەن ••

لەم کاتە ناسکەدا کۆمەڵی موسڵمان سەیری ستەمی ستەمکاران و دەستە پاچەیی ئادەمییەکانی تر

ئـەکـات ، خەریکە دڵـی لـەرزەی پێ کەوێ و بەرگـە نـەگرێ •• لەولاوە سەیری بـەڵێنەکەی ئـەکـا کـە بـە نـاوی ئـاینی خواوە داویـەتـی ، کـە رایگـەیـانـدووە شـوێنـکەوتەی راستییە و مەبەستی پەخشان کردنی چاکەیە لـە سەر زەویـیـدا ، شـەرم ئـەیـگرێ ••

بـەڵام خوای خـاوەن بـەزەیی کـە لـە دڵسۆزیی و راستگۆیی کۆمەڵی خۆنەویست ئـاگادارە ، دەستی یارمەتیی بۆ درێژ ئـەکـات •• دەرمانی ئـەم هەڵوێسـتە نـالـەبارەی پێشـکەش ئـەکـات ، تـا لـەرزەی پێ نەکەوێ و لـە نـاو گێژاوی پڕمەترسییدا نەخنکێ •• هیدایەتی ئەدا تـا ئـاوڕێ بداتـەوە بە لای قورئانەوە •• کۆمەڵـە ئـایەتێك ئـەنێرێتە خوارەوە تـا دەرمانی دەردی هەموو کۆمەڵێکی موسڵمان بێت لـە هەموو کـات و شوێنێکـا ••

ئـەم کۆمـەڵـە ئـایەتـەی کـە واین لـە خزمەتیانـا فێنك کـەرەوەی دڵـی هەموو کۆمەڵێـکی ئیمانـدارن ، لـە کاتێـکا کە لە دەوری قورئـان کۆ ئـەبێتەوە و بەرژەوەندیی پەرسـتە بەدکـارەکـانیش دژی ئـەوەستن ••

کۆمەڵی خۆنەویست پێویستە ئاگادار بێ : خوانەناساز لێی رازیی نابن تا لە ئیسلام پاشگەز نەبێتەوە .. تا نەبێت بە نۆکەری ئەڵقەلەگوێیان .. تا شەرەف و رێزی خۆی نەخاتە ژێر پێیانەوە .. دیارە مردن زۆر ئاسانتر و پیرۆزترە لەمانە .

بەڵام هەر چۆن بێ خوای خاوەن بەزەیی ئێمەی لاواز و بێ دەسەڵات زۆر چاك ئەناسێ ، بۆیە سەرەنجامی زۆرانبازیمان پیشمان ئەدا تا دڵمان لە خشتە نەبرێ و دەستمان سارد نەبێتەوە ..

هیوا دارم خوای گەورە کۆمەکیمان بکا تا مان و مردن بخەینە ئەولاوە و بە بێ دوودڵیی باوەش کەین بە قورئانا و بێ پەروا و بە دەنگیی بەرز و مەردانەوە پێشکەشی ئادەمییە دەستەپاچەکانی بکەین .

نووسەر

سیروان .. شوباطی / ١٩٨١ ز

رەبیعی دووەمی / ١٤٠١ ك

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ كَانُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَضْحَكُونَ
﴿٢٩﴾ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمُ
ٱنقَلَبُوا۟ فَكِهِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوٓا۟ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ
لَضَآلُّونَ ﴿٣٢﴾ وَمَآ أُرْسِلُوا۟ عَلَيْهِمْ حَٰفِظِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱلْيَوْمَ
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنَ ٱلْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ ﴿٣٤﴾ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ
يَنظُرُونَ ﴿٣٥﴾ هَلْ ثُوِّبَ ٱلْكُفَّارُ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾

صدق الله العظيم        له سوره‌تي « المطففين »

ئـه‌م هه‌شت ئـايه‌ته‌ی سوره‌تی « المطففين » كه وايـن له خزمه‌تيانا ، دوايين به‌شی سووره‌ته‌كه‌يه ، كه له قورئانی مه‌ككيه و لـه كاتێـكا هاتوونه‌ته خواره‌وه كه‌وا كۆمه‌ڵـی

موسڵمانی کەمدەسەڵاتی مەککە ، لە ژێر ئازار و سـزا و توانج و تەشەر و گاڵتـەی قوڕەیشـدا ئەتلایەوە •• ئـەم ئـایەتە پیرۆزانە ، و ئـایەتەکـان و سـوورەتەکـانی تـری مەککە ، ئـەهاتنە خوارەوە تـا دڵخۆشیی و دڵنیـکیی بن بۆ کۆمەڵـە موسڵمانەکەی مەککە و بۆ هەموو کۆمەڵێـکی تری موسڵمان ـ لـە هەموو کـات و شوێنێـکا ـ لە کاتێکـا کـە بەو قۆنـاغەی مەککەدا تێ ئەپەڕێ ••

بەڵێ ، ئـەم قورئانە پیرۆزە نەخشەی بانـگ کردنـە بۆ لای خوا •• نەخشەیە بۆ کۆمەڵی موسڵمان ـ لـە هەموو سەرزەویدا ـ تـا بە پێی قۆناغـەکانی بانگەواز کەڵـکی لـێ وەرگرێ و بیکـاتـە چارەسـەری تـا هـەنـگاو لـە دوای هەنـگاو رێـگای سەخت و پڕ دڕك و داڵ و مەترسیی ـ بـە پشتیوانیی خوای گەورە ـ ببڕێت ••

بـا هەمیشـە لـە یادمـان بێ قورئـان بـۆ بانگکەرانی ئیسـلام هاتووە •• نەك بۆ خوێندنـەوە و لـە بەرکردنێـکی رووت کـە هەندێ گۆشەگیر پێی هەڵئەسن ••

ئـەم ئایـەتە پیرۆزانـە هەڵـوێستی کۆمەڵی دەسـت

ڕۆیشتووی شەیتان بەرامبەر بە کۆمەڵی کەم دەسەڵاتی قورئان دەر ئەخەن ، ئینجا لە بەرامبەریا سەرەنجامی کۆمەڵی خواناس و کۆمەڵی خوانەناس ، لە ڕۆژی قیامەتا ، ئەخەنە پێش چاو ..

کۆمەڵی شەیتان ، کە ڕەفتاری هەموو ئەندامێکی بریتیە لە سووکیی و بێ شەرمیی و بێ ئابڕوویی ، کە سەیری کۆمەڵی ئیماندار ئەکات ، وا کەم تفاق و بێ دەسەڵاتە وە سەیری خۆیشی ئەکا ، کە هەموو ناڕەوایەکی بە ئاسانیی لێ ئەوەشێتەوە و بە دەروونی نزمی ئەندامەکانی سەیری وردی زلی بۆش و فیز و دەمار و کەش و فشی بێ جێ و شوێنکەوتەی خەڵەتاو و سامان و تفاقی بە ناڕەوا کۆکردووی ئەکا زۆر بە ئازایەتیی و جوامێریی ئەزانێ بە جیهانی بسەلمێنێ کە ئەو توانای توانەوەی کۆمەڵی ئیمانداری هەیە ! وا ئەزانێ ترازووە نالەبارەکەی و لێکدانەوە ساویلکەکەی ئەو ، بەسە بۆ دیاریی کردنی سەرەنجامی زۆرانبازیی !

کۆمەڵی ئیماندار کارێکی نییە بە سەر کۆمەڵی

دڵڕەشەوە ، ئەم ئەیەوێ بەندایەتیی بۆ پەروەردگاری دەرخا ، ئیتر بە هەر شێوەیەك بێت ..

کۆمەڵی ئیماندار ئامادەیە فەرمانەکانی پەروەردگار ببیستێ و پیت بە پیت پەیڕەویی بکا ..

بەڵام کۆمەڵی شەیتان ، هەر بە بوونی کۆمەڵی خواناس ، هەست بە تیاچوونی خۆی ئەکا ، بۆیە هەموو ڕێگایەکی دڕندانە ئەگرێتە بەر بۆ لە ناو بردنی .

کۆمەڵی خوێنمژ و ستەمکار خۆی چاك ئەزانێ بە ڕەنجی داماو و هەژارە بێ دەستەڵاتەکان ئەژی ، وە کاتێ ئەمان شوێنی ئیسلام ئەکەون ژیان و ڕابواردنی ئەو ئەکەوێتە مەترسییەوە ، چونکە ئیسلام بریتییە لە ڕزگارکردن بە هەموو واتایەکیەوە !

کۆمەڵی تاوانکار کە ئەبینێ ، قوتابخانەی قورئان موسڵمانی دڵسۆزی تیا کۆ ئەبنەوە ئەوەندەی بۆ ئەمێنێتەوە دەست بداتە دڵ شکاندن و هەست بریندار کردنی موسڵمانەکان ..

بەلام با سەرنجی ئایەتە پیرۆزەکان بگرین :

قورئانی پیرۆز وەها باسی رەفتاری سووك و بێ رەوشتیی کافران و سەرشۆڕیی دواڕۆژیان ئەکا کەوا موسڵمان بە تەواویی و بێ دوودڵیی سەرەنجامی بێتە بەر چاو • وای پیشان ئەدا ئەم جیهانە تەواو بووە و زۆرانبازیی ئەم جیهانە هەر ئەنجامێکی بوو بێ بڕاوەتەوە و لە بیر چۆتەوە و رۆژی قیامەت هاتۆتە پێشەوە ••

وەهای باس ئەکا کە ئێستە قیامەتە و بێشەرمیی و بێ ویژدانیی خوانەناسە تاوانکارەکانی سەرزەویی ئەگێڕێتەوە کە دژی موسڵمانەکان ئەیانکرد :

« **ان الذين أجرموا كانوا من الذين امنوا يضحكون** » ••

تاوانکاران هەر ئەوەیان مابوو بە موسڵمانە ئیماندارەکان پێ بکەنن و گاڵتەیان پێ بکەن ••

ئەبێ بۆچ گاڵتە بە موسڵمانان بکەن ؟

خۆیان زۆر بە تەواو ئەزانن ؟

خۆیـان زۆر بـه ژیر و پێشـکەوتوو ئـەزانن ؟
خۆیـان بـه خـاوەنی ڕێز و پـایه ئـەزانن ؟
یـان شانـازیی ئـەکـەن بـه کۆمـەڵـه یەکسـان و یەکگرتووە ڕێـك و پێـکەکەیانەوە ؟!

بێباوەڕان بـێ شـەرمن •• سـەرنجی کۆمـەڵـه گەنیوەکەیان نـاگـرن که نـه ئـارامیی و نـه ئـاسـایش و نـه ڕەوشت و نـه ویژدانی تیـا دەست نـاکەوێت •• زۆر بێ شـەرمن •• لـه جیاتی ئـەوەی ئـاوڕێ بـدەنـەوە بـه لای ئـابڕووی تـکـاویـانـەوە ـ که هەموو بێئابڕوویەك دەورەی داون ـ بـه موسڵمانـه ئیمانداره بێدەستەڵاتـەکان پێ ئـەکەنن ••

موسڵمانەکـان بێتـاوانن •• تەنها ئـەوەیه لـەوانەیه هەژار بن ، یـا بێدەسەڵات بن و نـەتوانن خۆیان لـه ستەم و دەست درێژیی پارێزن وه یـا لـه بـەر ڕێز و ئـابڕووی خۆیان ، خۆیان نەکەنه هاوشانی نەفـامـان ••

موسـڵمانـان پێویسته بێبـاك بـن •• سـتەم و

دەست درێژیی کافران هیچی تیا بەسە نییە ، چونکە ئەمان هەڵگری بیروباوەڕێکی وەها بەرز و پیرۆزن بە دژایەتیی کافران هیچ زیانێکیان پێ ناگات ••

گاڵتە و پێکەنینی نەفامی بێ شوورەیی بە موسڵمانی رەوشت بەرز ، زۆر ستەمە ؟ بەڵام موسڵمان شوێنکەوتەی نەخشەی پەروەردگارە •• پەروەردگاری مەزن فەرمانی بە سەرا داوە ئارام بگرێ •• هیچ بەرهەڵستیی و بەرگرییەك ناگاتە ئارام و دەروون بەرزیی ••

« واذا مروا بهم يتغامزون » •

رەفتارێکی تری ناشیرینی خوانەناسان ئەمەیە کاتێ موسڵمانێ بە لایانا تێپەڕایە ، هەوڵیان ئەدا بە چاوداگرتن و ئیشارەتی جۆر بە جۆر بیشکێنن ، بۆ ئەوەی لە بەر چاوی خەڵقیان بخەن و مەردمیان لێ دوور خەنەوە ـ کە ئەمەیش چەکی کەسانێکە کە هەست بە رووخاویی و بێ نرخیی خۆیان دەکەن ـ وە تا هەست بە کەمیی خۆی و لاوازیی رێبازەکەی بکات و

شـەرم بیگرێ •• دیـارە ئـەمەش لـە مرۆڤی بێ نرخ نەبێ لـە کەسی تر نـاوەشێتەوە ••

**« واذا انقلبوا الی أهلهم انقلبوا فكهين » ••**

ئینجـــا دوای ئـەوەی بـــە ئـارەزووی دەروونـــە لارەکەیـان بـە موسڵمانەکـان پێ ئـەکەنین و گـاڵتـەیـان ئـەکرد ، بـە فیز و دەمـارێکەوە و بەوپـەڕی خۆپەسەندیی و لـە خۆ رازیی بوونەوە و بـە روویەکی هەمە جۆر و لـە خۆ بـایی بوونەوە ئەگەڕانەوە نـاو ماڵ و منداڵ و کەس و کـاریـان •• گوایـە سەرکەوتنیان بـە دەست هێنـاوە ، بێ ئـەوەی هەست بـە تـاوانـەکەیان بکەن و لۆمـە و گلەییەك لـە خۆیـان بکەن ••

ئەمەیە هەست و هۆشی مردوو •• کۆمەڵی نـەفـامیی هـەر ئەندامێـکی بدوێنە خۆی بـە زانـایەکی چاکویسـت ئـەداتـە قەڵـەم •• کـەچی بـۆ هـەموو دز و جـەردە و خراپویسـتێك بـاوەشی خۆشـەویستیی ئەکـاتەوە و بـەم شـێوە نـالـەبارەش دژی تـاقـە کۆمەڵی پـاکی ئـادەمیزاد ئـەوەستێ •• بەم شێوەیە ئەبێتە دڕندە و بێ پـەروا ڕاوی

ئـادەمییە دەست و دەم و دڵ و دەروون پاکەکـان ئەکات ..
ئینجـا بێشەرمیی و بێئـابڕوویان لـە سـنوور دەر ئـەچـێ :

« واذا رأوهـم قالـوا : ان هؤلاء لضـالون ! » .

وە کـاتـێ چـاویـان بـە ئیمانـدارەکـان بکەوتـایە ئـەیانوت : ئەمانە گومڕان !!
ئـەمـانە گومڕان !!

هـەروەك خۆیـان شوێنـکەوتـەی چاکترین ڕێباز و بـەرزترین یـاسـا و پاکترین ڕەوشت و خوو بن .. خۆیان ڕێـگای ڕاستەقینەیان دۆزیبێتـەوە و موسڵمانەکـان سەریان لـێ شێوابێ و لـە خۆشیی و کـامـەرانیی و سەربەرزیی و پـایـە و پلـە بێ وێنـەکـەی ئـەوان بێبـەش بوو بن ..

زۆر سـەیرە .. سـتەمکـاران ، بـێئـابـڕوان ، دەستدرێژیی کەران ، لـەسنووردەرچووان ، بێویژدانـان و بێنرخان گومڕایی و سـەرلێشێوانی خۆیانیـان لـە بیـر ئـەچێتەوە و باسی هیدایەت و گومـڕایی ئـەکـەن .. وە

بەوپەڕی متمانــە و بە خۆدا پەرمینەوە ئیماندارە خواناسەکان بــە گومڕایی و سەرلێشێوان و لــە ڕێی ڕاست دەرچــوون تاوانبار ئەکەن •

بــەڵێ ، ئەمە هەڵویستی تــاوانــکارانــە •• شــــەرم نــایــانــگرێ و تەریق نــابنەوە کاتێ بــە نــاڕەوا بڕیــاری نــەشــیاو و نــەگونجاو ئەدەن •• هیچ بــە شوورەیی نازانن دەســتی چــەوریــان بســوون بــە ســەری بێتــاوانــانــا و پــاگــاندەی نــابــەجێیان بۆ بکەن • ئەمە سروشتی هــەموو تــاوانــکارێــکە بــە درێژایی مێژوو • ئەمەیش ئەوپــەڕی نــاڕەوایی و لــە سنووردەرچوونــە ••

نەفــامــان کــاتێ پایەی قەڵای ستەم و جەوریان کەوتە لــەرزە ، ئــەویش بــە وریــــا بوونــەوە و لــە راســــتیی گەیشــتنی کۆمەڵێــکی ئیماندار ، ئاچارن ـ وەك پەنــا ئەبەنە بــەر زۆر و ستەم ـ پەنــا بــەرنــە بــەر پــاگــاندە و وتــەی نــابــەجێ ، تــا کۆمەڵی راســتیی ویســت لــە بــەر چاوی ئــادەمیەکــان تــاوانبارکەن •• جــا لــە پێشــەوە لــە بــەر بێ ئــاگــایی خەڵــکیو دەرنەکەوتنی هەڵــوێستی کۆمەڵی

ئیماندار بە کردەوە لە بەر چاویانا ، باوەڕ بە درۆ و فیشاڵی خوانەناسان ئەکرێت •• ئەمەش دیارە تەنك هەڵچنینێکە بە کۆمەڵی موسڵمان بەڵام تاکە چارەسەر بۆ بڕینی ئەم قۆناغە سەختە پشت بەستن بە خوا و دڵبەستن بە فەرمانەکانیەوە و ئارام و دان بە خۆدا گرتن و بەردەوامبوونە لە سەر رەوتی راستەقینە بە پێی نەخشەی پەروەردگار ، بە بێ دوودڵیی و ئاوڕدانەوە و خۆخلافاندن ••

ئەم هەڵویستە ناڕەوایەی خوانەناسان ، ئەوەندە بێ جێ و نەگونجاوە ، قورئانی پیرۆز بەوپەڕی گاڵتە پێکردنەوە باسیان ئەکا ، کەوا ئەوەندە ساویلکە و مناڵن، خۆیان هەڵ ئەقورتێنن لە کارێکدا کە بە هیچ شێوەیەك کاری سەرشانی ئەوان نییە •• لە ساویلکەیی و بێڕەوشتیی و نەزانکاریی خۆیانەوەیە وا ئەم هەڵوێستە ناشیرینە ئەگرنە بەر :

« **وما ارسلوا عليهم حافظين** »

کێ ناردوێتی بە دوایانا و دەسەدامێنیان بووە ؟

کێ ئەوانی بە چاودێر و سەرپەرشتیار وەرگرتووە ؟ کێ هەڵسەنگاندن و ناسینی موسڵمانەکانی بەوان سپاردووە ؟ کەی پێویستە ئەوانی نەفام و نەزان و هەرزە بەم کارە گەورەیە هەڵسن ؟ ئەوە کەی کاری سەرشانی ئەوانە ؟ ئەوانی گێل و چاوبەستراو کەی توانیویانە خۆیان بناسن وە یا خۆیان چاك بکەن تا بیانەوێ بەندە راستەقینەکانی خوا بناسن و راستیان بکەنەوە ؟

بە هەر شێوەیەك بوو ژیانی سەرزەویی تەواو بوو ، سەرەنجامی زۆرانبازیی نێوان ئیسلام و کوفر ، لە قوناغی سەرزەوییدا ، بڕایەوە و کۆمەڵی خوانەناسی بێویژدان ـ لە هەموو چەرخ و شوێنێکا ـ چەندێ دەستی رۆیشت درێغیی نەکرد ..

تا توانییان موسڵمانیان بەند کرد .. سەریان بڕین .. بە مشار دایان هێنان .. بە شانەی ئاسنین گوشت و ئێسقانیان جیا کردنەوە .. هەڵیان دانە ناو ئاگرەوە و داخیان کردن .. لە سێدارەیان دان .. بە هەموو شێوەیەکی تر شەهیدیان کردن .. تا توانیان لە ئازار و

سزا و ئەشکەنجە و گاڵتــە و فشەی نــا بــە جێ و پێــکەنین درێغییان نــەکرد •• کۆمەڵی موسڵمانیش دامەزراوتر لــــە شــاخ بەوپەڕی ئــارام و خۆگرتنــەوە ، بە خوێنمــژان و ستــەمکارانیــان سـەلمـاند ، هیچ هێــزێــکی خوانــەنــاس ــ هەرچەندە دەسەڵاتی زۆر بێ ــ ناتوانێ ئــەوان لە خشتە بەرێ و لەرزە بخاتە دڵیــانەوە •• پێیــان سـەلمـاندن ئــەو بیروباوەڕەی ئــەوان شوێنی کەوتوون ئەوەندە بە هێزە ، هێز نییــە بتوانێ لە بەردەم رووناکیی و هیدایەتیا خۆی بگرێ•• کەواتە قوڕ بــە سـەر سەربازانی شــەیتان وا خۆیان ماندوو ئەکەن •• پێیان سەلماندن کــە ئەگەر ستەمکاران دەستیان بڕوا بــە سەر لاشە و خوێن و گۆشتا ، بــە هیچ شـێوەیەك دەستیان نــاڕوا بــە سەر دڵــە هۆشیارە پڕ لە ئیمانەکانیاندا••

بەڵێ ، هــەر چۆن بوو ژیــانی سـەرزەویی کۆتــایی هات و هەموو کۆمەڵە نەفــامییەکــان بــە کــاری نــاڕەوای خۆیان هەڵسان دژی بەندە گوێڕایەڵــەکــانی خوا و ئەمانیش پیاوانە ، مەردانە ، پاڵــەوانــانە لــە بەر دەمیانــا ئــارامیـــان گــــرت ••

وا ئێستەش رۆژی قیامەتە •• رۆژی بێ دەسەڵاتی و بێکەسیی و بێ سامانییە •• ئەمڕۆ رۆژێکە ، پێغەمبەران و فریشتەکان پێویستە ماوە بخوازن بۆ ئەوەی قسە بکەن •

رۆژی سەخت و ناهەموار هاتۆتە پێشەوە و هەرچی دروستکراوی خوا هەیە ، دەستە پاچە دا ئەکەوێت ••

کوان ستەمکاران ؟
کوان دەسترۆیشتووان ؟
کوان جەللادەکان ؟

کوان خوێنمژەکان کە ئادەمیزادی هەژاریان کردبووە نێچیری خۆیان ؟
کوا کۆمەڵی شەیتان کە بەرامبەر بە موسڵمانەکان درێغیی نەئەکرد ؟

هەموویان ئامادەن ، بەڵام دەستەپاچە و بێدەستەڵات، ماڵ کاول و سەرگەردان ••
ئەی کوا کۆمەڵی چاکویستی خواناس ؟
هەموویان ئامادەن •• بەڵام بە سەری بەرز و

رووممەتی گەشاوە و دڵی شادمـانـەوە ..

ئـەمڕۆ نـوێژەی کۆمـەڵی خوانـاسە پاداشـتی خۆی وەرگرێتـەوە ..

تـاوانـکاران بـە تـەمای ئـەم ڕۆژە نـاهـەمووارە نەبوون ، کەچی وا قڵپ بوونەتەوە نـاوی و یـەخـەی پـێ گرتـوون ..

ئیجا دوای شادبوونی خوانـاسان بـە ژیانی بەهەشت و خوانـەنـاسان و بێ باوەڕانیش بۆ دۆزەخ نێران ، هـەر کۆمەڵێـکیان شوێنی ئـەوی تریان ئەبینێ ..

موسـڵمانـان لـە خۆشـیی و رابـواردنـی دڵڕفێنـی بـەهـەشتا و بەینـا و بەین بە دیداری پەروەردگـار شـاد ئەبنەوە . کـافرانیش لەگەڵ ئـەوەدا کە لـە بینینی خـوا بێبەش و نائومێد ئـەبن و ئێش و نـازاری ئـەم نـەبینینـە ئـەچێژن ، لـەو لاوە لـە خۆشیی و شادمـانیی و رابواردنی بەهەشت بێبەش ئەبن و بـە سـزای سـەختی دۆزەخیش ئـەگـەن ..

موسـڵمانـەکـان لـە شـــوێنی رازاوە و دڵ رفێنـی خۆیانـەوە بـە سـەر چارپـای بـەهـەشتـەوە بـە خۆشیی و کـامـەرانییەوە خەریکی رابواردنن ، و سەیری ئـازار و سزای دوژمنە خوانەنـاسەکـانیان ئـەکەن ، ئـەوانەی کـە لـە جیهاندا درێغییان نـەئـەکرد و هـەمـە جۆر رێـگایـان ئـەگرتـە بـەر بۆ دڵسـارد کردنـەوەیان •• سـەیریـان ئەکەن بـە دەست چەرپەدوو کەڵ و گرمە و نـاڵـە و ئـازاری سەخت و بڵێسـەی ئاگری گڕ بـە گڕی دۆزەخەوە گیریان خـواردووە :

« **فاليوم الذين امنوا من الكفار يضحكون • على الأرائك ينظـــرون** » •

ئـا لـەم رۆژەدا و لـەم هەڵـوێستـەدا موسڵمانەکـان پڕ بە دڵ بـە کـافـرە ستەمکـارەکـان پێ نـەکەنـەوە •• تۆڵەی خۆیان بکەنەوە•• بەوپەڕی خۆشیی و کامەرانییەوە ، پـاڵیـان لـێ داوەتـەوە ••

رابواردن و پێـکەنینی کـافران بـە موسڵمانـەکـان لـە سـەر زەوییدا ، بۆ ماوەیەکی کەم بوو ، بەڵام رابواردن

و پێکەنینی موسڵمانەکان بە کافران لە قیامەتا هەمیشە و بەردەوامە •• کافران بە ناڕەوا دژی موسڵمانەکان ئەوەستان و پێیان پێ ئەکەنین •• بەڵام موسڵمانەکان زۆر جێی خۆیەتی ئاوا خوای خاوەن دەسەڵات ماوەیان ئەدا تا تۆڵەی خۆیان لە کافران بکەنەوە ••

وە کافران چەندێ دەستیان ڕۆیشتبێ ، سەرەنجامی هەردوو جیهانیان ڕووڕەشیی و سەر شۆڕیی بووە ، بەڵام موسڵمانەکان خۆشیی و ڕابواردنەکەی بەهەشتیان هەمیشەیە و ، لە ژیانی هەردوو جیهانیاندا ، هەر چۆن بووبێ ، هەر سەربەرز و ڕووسوور بوون •

ئەمەیە پاداشتی کۆمەڵی گزیکار و بێویژدان :

« **هل ثوب الكفار ما كانوا يفعلون** ؟ » ••

لە کۆتاییدا قورئانی پیرۆز بە گاڵتەیەکی جەرگ بڕەوە پرسیار ئەکا : ئایا کافران لە سەر ئەو کردەوانەی کە پێیان هەڵئەستان ، پاداشتیان وەرگرت ؟!

پـاداشت !!
ئەوپەڕی گـاڵتـەپێکردنە ••
چۆن پـاداشتێك ؟!
ئـەو پاداشتەی کە سزای سەختی دۆزەخ بێت ! مەگەر خوای گەورە خۆی بزانێ ئـەو سزایە چەند سەختە ، چونکە ئـەوەی بۆ ئێمە باس ئـەکرێ لێی ، بـە پێی بیر و هەستی ئێمەیە •• وە تـا ڕۆژی خۆی نەیەت نـە بەهەشـت و نـە دۆزەخ کەس نـازانـێ خۆشـیی و نـاخۆشـییان چۆنـە و چەنـدە !
خوای گـەورە ویستی دڵخۆشـیی کۆمـەڵـە کـەم دەسەڵاتـەکەی مەککە بداتـەوە ، چونـکە سزا و ئـازاری بتپەرستەکان(۱) زۆر بەتین بوو ، کوڕی ئەویست لـە بـەر

---

(۱) نەفامان وای لێك ئـەدەنەوە لـەم چەرخەدا بتپەرسیی نـەمـاوە ، نـازانـن جگـە لـە مـوسـڵمـانـە شوێنکەوتووەکانی قورئـانی پیرۆز ، هەموو کەسـێ لـە بـەیـانییەوە هەتـا ئێوارە دەست بۆ چەنـدەهـا بت پـان ئـەکـاتەوە و بـە گوێی چەندەها بت ئەکات و مل بۆ چەندەها بت کەچ ئەکات !

شالاویا خۆی بگرێت •• خوایش خاوەنی بەزەییە و چاوی لە کۆمەڵە کەمە دلسۆزەکەی کلا ناکات ، چونکە ئەو کۆمەڵە کەمە تۆوی چاکەیە لە هەموو سەرزەوییدا ••

کە موسڵمانان سەرنجی قورئانی پیرۆز ئەگرن وا بەم شێوەیە باسی ئێش و ئازارەکانیان ئەکات ، دڵیان فێنك ئەبێتەوە •• چونکە پەروەردگاری بەدەسەلاتیان باسی تەنگاویی ئێش و ئازارەکانیانی کردووە ، وە خۆی چاك ئاگادارە و چاوی لێیانەوە ، جا ئەگەر بۆ ماوەیەکی دیاریی کراو ماوەی کاعران بدا ، ئەوە ناگەیەنێ دەستبەرداری موسڵمانەکان بووە • جا هەستکردنی موسڵمانەکان بەم خۆشەویستیی و چاودێرییە خواییە ، بەسە بۆ سارێژکردنی زامەکانی دڵیان و دامەزراندنی •• خوای گەور چاوی لە گاڵتە و توانجی تاوانکارانە ، کە چۆن ئازاری ئیماندارەکان ئەدەن ، وە چۆن پێیان را ئەبوێرن •• لەگەڵ ئەوەشا شەرمێ نایانگرێ و لە سەر کردەوەی منالانەیان پەشیمان نابنەوە •• خوای گەورە ئەمە هەموو ئەبینێ و لە پەڕاوە بێگەردەکەیا باسی

ئـەكـا •• كەواتە ، پێویسـتە لـە قوڵاییی دڵـی هـەمـوو موسڵمانێـكـا جێگیر ببێ ؛ ئەم ڕەفتە سووكـانەی تاوانكاران لـە ترازووی خوادا شتێـكی زۆر گـەورەیـە و هـەرگیز چاوپۆشیی لێ نـاكـا و بـە سـەریـا نـاچێ •• دیارە ئەمە بـە لای دڵـی ئیماندارەوە زۆرە ئەگەر بێـت و سـەرنج بگرێت • هەرچەندە ئێش و ئـازاری زۆر بێ و زامەكـانی بـە سـۆ بن ••

جـا كـە خوای گەورە ـ جل جلالـە ـ بـەم شێوە پڕ سـام و هەیبەتـە گـاڵتـە ئـەكـان بـە بیرو و هەست و هۆشی تـاوانـكـارا و هەڕەشەی تیامەتیان لـێ ئـەكـات ، لـەوانـەیە دڵی ڕەشی بـە تـاوان داپۆشراویان هەستی پێ نـەكـات ••

بەڵام ئەمە گرنـگ نییـە ، چونـكە ئەمە دڵنـەواییـە بـۆ ئیمانداران كـە بـە هـەست و دڵ و دەروونی‌روونیـان هەستی پێ ئەكەن و ئـەزانن چەندە بەنرخە ؟ بۆیە ئەوپەڕی هێمنیی و ئـارامییان دەست ئەكەوێ ••

دڵـە پڕ لـە ئیمانـەكـان كـە سـەیری دڵـی

ڕەش‌هەڵگەڕاوی دوژمنـان ئەکەن بەرامبەریان و کـــە سەرنجی ڕێز و نرخی خۆیان ئـەدەن بە لای خواوە ، کـە چۆن خۆشیی و حەسانـەوەی بەهەشت و ڕێز و پایە بەرزیی جیهانی بـەرز و باڵا ( الملأ الأعلى ) ی پێ بەخشیون ، وە کە سەرنجی سووکیی و بێ نرخیی دوژمنان ئـەدەن بـە لایەوە کە چۆن سزای سەختی دۆزەخی بۆ ئـامـادە کردوون ، ئیتر بـا ســـووکیی و ریســـواییان لـە جیهـانی بـەرز و بـاڵادا بووەستێ •• کـاتێ هەست بەمە ئـەکـەن لـە هەڵوێستی هێز و ئیمانەوە ڕاستەوخۆ تـامی بـەری شیرینی ئیمانەکەیان ئەکەن و بـە جوانیی سەرەنجامی خۆیشیان و دوژمنانیشیان دێتـە بـەر چاو •• بەمە بـە جارێ کـاری سزاو ئـازار و گاڵتـە و توانج و تەشـەری تـاوانـکـاران و کەمیی و کەم هێزیی خۆیـان لـە ســەر دڵ و مێشکیان ئەشۆرێتەوە • هەتا جـاری وا ئەبێ هەندێ دڵ ، کـە جوانتـر بەستراون بـە خواوە ، ئەو تـاڵیی و ســوێرییـەی کـە پێیان ئـەچێژرێـت ئـەبێتـە مایـەی خۆشیی و شادمانیی کـاتێ بە وردیی و بـە جوانیی سەرنجی بەڵێنـەکـانی پەروەردگـار ئـەگرن ••

ئەمە بە جوانیی دەری ئەخا کەوا تائە دڵخۆشکەر و بەڵێن بۆ موسڵمانە چەوساوە بێدەسەڵاتەکان ـ لە هەموو کات و شوێنێکا ـ بەرامبەر بە رەفتاری منالآنە و سزا و ئازاری ناڕەوا و گاڵتە و توانجی بێ جێی تاوانکاران ئەم بڕیارە خواییەیە کە بریتییە لە : بەهەشت بۆ ئیمانداران و دۆزەخ بۆ کافران ••

ئەوە بوو پێغەمبەری خۆشەویستیش ـ صلی الله علیه وسلم ـ لە هەموو هەڵویستێکا تەنها ئەم بەڵێنەی ئەدا بە ئیمانداران ••

بۆ نموونە : کاتێ کە پێغەمبەری خۆشەویست ـ صلی الله علیه وسلم ـ دای بە لای خێزانی یاسردا ـ خوا لێیان رازیی بێت ـ فەرمانی پێ دان بە بەرگەگرتن و بەرامبەر بەمە مژدەی بەهەشتی دانێ ••

وە کاتێ موسڵمانەکانی مەدینە پەیمانی عەقەبەی دووەمیان لەگەڵ پێغەمبەردا ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەبەست •• پرسیاریان لێ کرد ئەگەر ئەوان سەروماڵیان

بکەنە قوربانیی بۆ پارێزگاریی خۆی و ئایینەکەی ، لە ئەنجاما چییان بۆ ئەبێت ؟

فەرمووی : بەهەشت ! ئەوانیش بەوپەڕی خۆشییەوە دەستیان دا بە دەستیەوە و بەیمانی کۆڵنەدان و واز نەهێنانیان ..

جا با هەموو موسڵمانێك ئاگای لەمە بێت ، کەوا هەوڵ و کۆششی موسڵمان بۆ سەرکەوتنی دنیایی نییە ، بەڵکو بەهەشت تاکە ئاواتی موسڵمانی ئیشکەرە !

بەڵام سەرکەوتنی کۆمەڵی موسڵمان لەم جیهانەدا و پشت شکاندنی کافرە دوژمنەکان بە هیچ شێوەیەك قورئانی مەککە باسی نەئەکرد لە شێوەی دڵدانەوەی موسڵمانەکانا !

بەڵێ ئازیزەکانم ، قورئانی پیرۆز بەیتا بەیتا ئەهاتە خوارەوە تا دڵی موسڵمانەکان پڕ بکا لە ئیمان و بەو ئیمانە خواییە پەروەردەیان بکا ، تا بتوانن

ئـەركی سەرشانیان ببەن بـە رێوە ، جـا زۆر پێویسـت بوو ئەم دڵانـە بە جوانیی پەروەردە بکرێن : بە شێوەیەك هێـز و پێـزێ وەرگرن تـا رەشەبـای نەفـامیی نەتوانێ ملیـان پێ کەچ بکـا ، وە خۆیـان و بەرژەوەندیەکـانیان وەها لـە بیر بچێنـەوە ، لـە کـاتی هەوڵ و کۆشش و بـەخشیندا و لـە کـاتی چەرمەسەرێ و ئـازار و سزای نـارەوادا بـە هیچ شـێوەیەك بیر لـە دەسەڵات و رابواردنی سـەر زەویی نەکەنەوە و جگە لـە ژیانی بەهەشت چاوەڕوانی هیچی تـر نـەبن •• پێویستە دڵی ئیماندارەکـان وەها پەروەردە بکرێ تـا ئـەگەر هات و ژیانی سەر زەوییان هەمووی تاقیکردنەوە و چەرمەسەرێ و سـزای بیرلێنـەکراوە و بێبـەشیی و قوربانیدان و بەرگـەگرتن بـوو ، بتوانـن بـە ئـارامـەوە بیبڕن : بێ ئـەوەی بە تەمای پاداشتی سەرزەویی بن ، ئەگەر چی ئەو پاداشتەش پەرەسەندنی بانـگـەوازی ئیسـلام و سەرکەوتنی کۆمەڵی موسڵمان بێت ••

جـا کـاتێ خوا کردی و ئـەم کۆمەڵـە موسـڵمانـە وەهـا پـەروەردە کرا ، کەوا تێ بگـا ژیانی ئـەم جیهانـە

بریتییە لە بەخشین و قوربانییدان بێ ئەوەی بە تەمای هیچێ لەم ژیانە بێ ، وە تەنها بە تەمای پاداشتی رۆژی دوایی بوو ، وە سەرەنجامی زۆرانبازیی رەوا و ناڕەوای لەوێ چاوەڕێ کرد ، وە چاکیی و پاکیی دڵی موسڵمانەکان بە راستیی دەرکەوت و ئەو پەیمان و بەڵێنەی کە بە خوای دابوو بردیە سەر ، خوای گەورە سەرکەوتنی ئەم جیهانەیان پێشکەش ئەکات و کاروباری سەرزەویی ئەخاتە دەستیانەوە ، ئەمەش نەك لە بەر خاتری موسڵمانێتی و راستگۆیی و پیاوچاکی کۆمەڵی موسڵمان ، بەڵکو لە بەر ئەوەی ئەم کۆمەڵە موسڵمانە جێی متمانەی پەروەردگار و بۆ ئەوە ئەشێ هەڵسوراندنی کاروباری ئادەمیزادەکان بداتە دەستی ، تا بە فەرمانی خوا هەڵیسووڕێنێ و لە سایەی قورئانا بیان حەسێنێتەوە

بەڵێ هەر کۆمەڵێ بەرژەوەندیی ئەم جیهانەی خستە پشت گوێ و بە پێی فەرمانی خوای گەورە کەوتە رێ و ئارامی گرت تا ئەو کاتەی کە خوای گەورە دیاریی

کردووە بۆ سەرخستنی کۆمەڵی موسڵمان ، هەر ئەبێت ئەو کۆمەڵە سەرکەوێ تائادەمیزادەکان تامی ژیانی سایەی قورئان بکەن .

لە کۆتاییدا وای بە جوان ئەزانم هەر یەکەمان بیرێ لە دڵ و دەروونی خۆی بکاتەوە و لەگەڵ پەروەردگاریا پەیمان تازە بکاتەوە و بڵێ :

خوایە یارمەتییت ..
خوایە کۆمەکییت ..

خوایە ئارام و بەرگەگرتمان پێ ببەخشیت تا بەو شێوەیە بیر لە ئیسلام بکەینەوە و هەوڵی بۆ بدەین کە لە قورئانە پیرۆزەکەتا بڕیارت داوە وموسڵمانە پێشینەکان لە سەری ڕۆیشتوون ..

خوایە یارمەتییت .. تا هەست و هۆشمان کۆ بکەینەوە و بڕیاری شوێنکەوتنی ڕێبازەکەت بدەین تا کۆتایی ژیانمان ، بێ بیرکردنەوە لە ئەنجامی زۆرانبازیی

ئـەم جیهـانـە ، وە تـاکـە ئـاواتەماز رەزامـەندیی تـۆ و سەربەرزیی قیامەتمان بێت ..

سبحان ربك رب العزة عما یصفون . وسلام علی المرسـلین . والحمد لله رب العالمین ...

